# خودبوون
# له شەوەزەنگدا

نووسینی
**کوردستان رەسوڵ**

**خودبوون له شەوەزەنگدا**

نـــووســـــینی : کوردســـــتان رەسوڵ

دیزاینـی ناوەوە : زەردەشت کاوانی

دیزاینی بەرگ : بـــاســـم رەســـام

چـــاپـــی یـەکـەم ۲۰۲۱ز

١٤* ٢١ ســـــم ، ٤٥ لاپـــــەڕە

# ناوەڕۆک







## پێشەکی

پرۆسەی پێشکەوتن، پرۆسەیەک نیە گەل و نەتەوەیەک، بە دیاری بیدات بە گەل و نەتەوەیەکی تر، بەکارهێنانی تەکنەلۆژیا نیە، هەمان بەکارهێنان، هەمان ئەنجامت بداتێ..

پێشـکەوتن پـرۆسەیەکە دەبێت هەڵقـوڵاوی مـنداڵانی نیشتمان بێت، بە پێی پێوەرەکانی ئەم مەملەکەتە بێتەبوون، ڕەنگدانەوەی تێرکردنی خواستی حەقیقی و زانستی ئێرەبێت، وەڵام کۆی پێویستیە ئینسانی و نیشتمانیەکان بێت..

بەدەر لەوە هێنانی هەر شێوازێک لە قاڵبی پێشکەوتندا کە لەسەر زەمینێکی تر لە دایک بووە، جگە لە کۆپی بوون هیچی تر نیە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کەڵک لە شێوازە سەردەمی و نوێ و مـــۆدێرنەکان وەرنەگرین و چـــەقبەستوو بیـــن، بەڵکو دەبێت هەر ڕێگایەکی نوێ کە مرۆڤایەتی پێی دەگات، ئێمە موتوربەی بکەین و کوردانە و خۆماڵیانە و بە پێی سەرزەمینی ئێرە بیخەینە خزمەتی خۆمانەوە....



# هەرتاکێک بەرپرسیارە لە پێشکەوتنی کۆمەڵگادا

تاک بە تاکی ئەم کۆمەڵگایە لە پرۆسەی بەرەوپێش بردنی کۆمەڵگادا، دەبێت خاوەن بیرکردنەوەیەکی لۆژیکی، عەقـڵانی، ئەکادیمی، بێ لایەنـــانە، موتور بوو بە پێوەری زانست و حەقیقەت و پەرۆش بۆ راستەقینە تێبکۆشێت....

هەریەکەو لە بازنەی خۆیدا و هەمووانیش لە بازنەیەکی گەورەدا کە هاوتەریبن لە فراوان بوونێکی خێرادا گەشە بە سەرجـەم لایەنـەکانی کۆمـەڵگا و تاک و وڵات بدەن،





سەرجەم چەقی بـــازنەکانیش یەک رایەڵە بە یەکیانەوە ببەستێتەوە کە بەرزی جەوهەری مرۆڤ و ئینسانی بوون و خەلیفە بوونیەتی لەم بوونەدا، هەرچەند سنوورەکان فراوان بن، هـــەرچەند سـنوری بازنەکان دوور تر بنەوە لە چەق، بەڵام ئەمە چەقە، ئەمە خەلیفە بوونی مرۆڤە مانا دەدات بە فـــراوان بوون و گەشەکردن هەر فراوان بوونێک لە ژێر سێبەری چەقدا ئیلهام و واتا وەردەگرێت .....



کاتێ خەلیفەبوونی مرۆڤ و جەوهەری بوونی مرۆڤ دەبێتە پێوەر، کاتێ هەر تاکێ هەست بە گەورەیی و بەرپرسیاریەتی دەکات، کاتێ هەر تاکێ لە ژێر سێبەری راستەقینەی خۆیدا بەرەو رووئیـــای خـــۆی دەڕوات، وڵات زۆر خێرا هەنگاو دەنێت .





# ڕێگاکانی پێشکەوتن

# دەبێت ڕێگای زانستی بن





دەبێت هەوڵ و کۆششەکان بەرمەبنای لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ و زانستی بن بۆ پێداویستیەکان و جۆری پێشکەوتنمان و دواتر ڕێگە و جۆری خزمـــەت و کۆشش خۆی بسەپێنێ، بەڵکو ئەو جــۆرە شێوازە باشەی لە هەوڵ و تێکۆشان کە مرۆڤــایەتی پێی گەیشتووە و پەیڕەو دەکرێت و بەرهەم دێتە ئارا ئەوە بۆتە باو، وە کاتێ ڕێگەی بەرەو پێش چوون دیارە و پەیڕەو دەکرێت ئەنجام و بەرهەم دیارە، بەڵام ئێمە دەمانەوێت لە بەرەنجـــامی پێویستی و خواست و سروشتی کۆمەڵگاکەمان شـێوازی بـەرەو پێش چــوون دیـــاری بکەین،



چونکە ئەو کاتە دەگەینە بەرهەمی گەورەتر کە لە هەناوی خۆمانەوە نزیکە و خۆمان دەبین، ئێمە دەمانەوێت منداڵدانمان سک پڕ بێت بە کۆرپەی خۆمان کە لە خۆێنمانەوە دێت، نەک منداڵدانمان کۆرپەی تری تێدا دابنێین و سروشتی نەبێت، بۆیە دەبێت ئێمە تاکەکانمان بەجۆرێ پەروەردە بکەین جۆرەها میتۆد بەکاربهێنن بۆ دیاری کردنی جۆری ئەو پێشکەوتنەی وڵاتەکەمان پێویستی پێیە، جیهانیانە بیر بکەینەوە، بەڵام لۆکاڵیانە کار بکەین، بێسنور ببینین و توانای بینینمان هەبێت، بەڵام هەموو تیشکی چاومان بخەینە سەر یەک پنت، توانای وەرگرتنمان زۆر فراوان بکەین، بەڵام دانەوەی ئەو توانا و هێزانە خۆماڵیانە و بە پێی خواست و پێداویستی





ئێرە بێت، زانایانە عاشقی زانین و رێگا جۆراو جۆرەکان بین، بەڵام پسپۆڕانە زانین بخەینە بواری جێبەجێکردن لەو سنورەی وڵات دەیخوازێت، زۆر کراوەبین بەرەو دەرەوەی خۆماندا، بەڵام داخراوبین لەو سنورە کارکردنەی پێویستی بە شێوازی تایبەت هەیە ...



## دەقگرتن بەیەک جۆری پێشکەوتنەوە

گیرسانەوە بە رواڵەت و توێکڵی شتەکان بەمانای بەتاڵکردنەوەی بەیانیە لە ناوەڕۆک، بە مانای دوورکەوتنەوەیە لە جەوهەر، بەمەش ئەمڕۆ کۆپی بەیانی دەکەین و بەیانیش، ئەمڕۆ دووبارە دەکەینەوە، بۆیە دەبێت شەوەکان پردی نێوان دوو ڕۆژی جیاواز بن، نیوەڕۆکان بازگەی نێوان دوو دانی ڕۆژ بن، بە گەورە بوونی بۆشایی نێوان ساتەکان شاگەشکە بین، بۆشایی نێوان ساتەکان بکەینە پێوەری پێشکەوتن.

دووبارە بوونەوەی ساتە وەک یەکەکان لە زنجیرەیەکی وەک یەک دا مانافیستی وەستانمانە لە بۆشایدا....

## دروست بوونەوەی بە بەرمەجەبوون

## کێشەیەکی تری تاک و کۆمەڵگاکانە

کاتێ مرۆڤەکان دەڕوانن، سنووری پێشکەوتنی مرۆڤ چۆنە، مرۆڤایەتی بەکوێ گەیشتووە لە زانست و توانا و تەکنەلۆژیا، باوەڕێک دروست دەکات لای تاکەکان کە ئەوە دوا سنوری توانا و هێز و پێشکەوتنی مرۆڤە، بەرمەجە بوونی تاکەکان بەوەی ئەم سنووره ببینن، بڕوایەکی کوشندەیە، چەندە چاو ببڕینە سنورەکان ئەوەندە سنوری هێز و تواناکان تۆخ دەکەینەوە و سنورداری دەکەین، چەندەش لە بێسنوردا بڕوانین و خەیاڵ و هۆشمان فێری فڕین بکەین ئەوەندە هێزی ئەفراندنمان بێسنور دەبێت، خوا کە مرۆڤی دروست کردووە هێزی زانین و سەردار بوونی ئەم گەردوونە فراوانەی تێدا فەراهەم هێناوە، بەڵام





ئەوە سەرقاڵ بوون بە رواڵەت و توێکڵ وای کردووە مرۆڤ لە خۆی دوور بکەوێتەوە و بۆشاییەکی زۆر لە نێوان خۆیدا دروست بکات، مرۆڤ چەندە سەرقاڵی شتە بچووکەکان بێت ئەوەندە لەخۆی دوور دەکەوێتەوە و بچووک دەبێتەوە تا وای لێدێت خۆی ناناسێت کە مرۆڤە، چەندەش خەریکی بڕینی رایەڵە نائینسانیەکان و دڕینی ئەو پەردانە بێت کە لە ناوەڕۆکی خۆی دابڕاوە، ئەوەندە دێتەوە ناو بوونی راستەقینەی خۆی و دەستی دەگات بە سەرچاوە بێسنوورەکانی زانین و سەردار بوونی ئەم بوونە و ئەو پێناس و نرخە وەردەگرێت کە خالق پێیداوە ....

ئێمە دەبێت کۆمەڵگاکەمان فێربکەین، ئەو دیوی سنور ببینن، نەک سنوورەکان ببینن، پێش مرۆڤەکان ببینن، نەک دوای مرۆڤەکان، چاویان و فکریان تیژ بکەین ئەو پانتاییە ببینن کە نابینرێت، چونکە داهێنان لە نادیاردایە و دەبێت بیهێنینە سنوری دیــارەوە، لە سنوری دیــاردا هەموو شتەکان خاوەنیان هەیە و بە پێشکەوتنی خۆیان گەیشتون، چەندە تواناى تاكەكانمان زیاد بکەین ئەم سنورە ببینن ئەوەندە زیاتر دەتوانین نائاشکراکان ئاشکرا بکەین و بچینە سنوری قەڵەم ڕەوی ترەوە.

پێوەری داهێنەرەکان، سەرکردەکان، ئەو مرۆڤانەی مێژوو و مرۆڤایەتی ناتوانێت هەرگیز لە یادیان بکات، شکاندنی ئەو تەلیسمانەیە کە مرۆڤانی ئاسایی تێیدا بەندبوون، شکاندنی ئەو بەربەستانەیە، کە ئینسانە بچووکەکان تەسلیمی بوون، پارچە پارچەکردنی ئەو وێنانەیە کە جەبری ژیانیان پێبەخشیوین و تەنها سەرابێکن .......

مرۆڤە داهێنەرەکان و سەرکردەکان ئەوانەن جارێکی تر بوونمان بۆ پێناسە دەکەنەوە، توێکڵ دەگێڕنەوە بۆ ناوەڕۆک و ناوەڕۆک بۆ توێکڵ، هەبوون بۆ بوون و بوون بۆ هەبوون، مانا دەدەنەوە بە بێمانایی و بێمانایی بۆ مانای بێمانا، وێنە تەلیسماویەکان دەشکێنن و پارچە شکاوەکانی وێنە راستەقینەکان لێک دەدەنەوە ..



له مێژوودا مرۆڤە دواکەوتوو ناداهێنەرەکان وایان زانیوە ئەوە ئەوپەڕی سنووری پێشکەوتنی مرۆڤە، بەڵام ڕۆژ دوای ڕۆژ سنووری نادیار ئاشکرا تر بووە، بۆیە دەبێت کۆمەڵگای ئێمە بەم باوەڕە بگات ئەو زانست و تەکنەلۆژیا و پێشکەوتن و دنیا سەر سوڕهێنەرەی لە پێشمانەوەیە و لە داهاتوودا مرۆڤ ڕەنگە پێی بگات زۆر گەورەتر و سەرسووڕهێنەر ترە لەوەی تێیدا دەژین و لە دوای خۆمانەوە جێمان هێشتووە ...



توانای تاقیکردنەوەی ئەگەرەکان، بڕینی ڕێگاتەی نەکراوەکان، ئەزموون کردنی ئەزموون نەکراوەکان، خوێندنەوەی پەرتووکە نەخوێنراوەکانی ئەم بوونە، بینینی نەبینراوەکان، هەبووەکان بکەین بە بوون، بوونەکان بکەین بەبوونێکی جیاوازتر، سەنگی مەحەکی بوونمانە و مانا دەبەخشێ بە بوونمان ...



بۆیە چەندە خەیاڵی تاکەکانمان گەورەتر بکەین، سنوری بیرکردنەوەیان فراوانتر بکەین، ئاسۆی روانینیان رووناکتر بکەین، بیانگوازینەوە ئەو پانتایە گەورەیەی کەشف نەبووە، ئەوەندە هێزیان گەورەتر دەکەین و زوتر جیهانە نادیارەکەمان بۆ دێننە ناو جیهانە دیارەکەوە، جیهانی نائامادە دێننە جیهانی ئامادەوە، بەقەدەر ئەوەی ئێمە پێشڕەوی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی و شارستانیەت وەردەگرین ....



# بەهای کات
## لای مرۆڤی پێشکەوتوو







چەندە تەمەنی مرۆڤ زیاتر بێت، خیبرەی گەورە تر بێت، ئەزموونی فراوانتر بێت، ئەوەندە مانای سەعات و ساتەکان گۆڕانی بەسەردا دێت و گەورە تر دەبێت، بارتەقای ئەو ماناو ئەزموون و خیبرەیەش بەرهەم و تواناکان گۆڕانیان بەسەر دادێت و گەورە تر دەبن ...

کاتێ ئێمە گیرۆدەی بەرهەمی کاتە لەیەک چووەکان دەبین و بۆ هەمان کات هەمان بەرهەم و توانا پێشان دەدەین، مانای وەستانی خیبرە و فکر و تەمەنمانە لە زەمەنێکدا، بۆیە دەبێت بەم جۆرە سەیری کاتژمێرەکان و رۆژەکان بکەین لە زنجیرەیەک، ئەڵقەکانی هاوشێوەن لە چەندایەتی ژمارەدا، بەڵام لە چۆنایەتی دا ئەم زنجیرەیە ئەڵقە دوای ئەڵقە گەورەتر و گەشاوەتر دەبێت لە بەرهەم و داهێنان و توانادا...



تەنانەت هەنگاوێک زیاتر دەڕۆم و جورئەتی ئەوە دەکەم بڵێم، هەر سەعاتە و داواکاری گەورە لە مرۆڤ کراوە، سەعات دوای سەعاتیش داواکاری گەورەتر و جیاوازترە، وەڵام نەدانەوەی دواکاریەکان دروست بوونی بۆشایی گەورەیە لەو زنجیرە هەمەڕەنگەی کە ژیانی مرۆڤەکە رەنگ رێژ دەکات، دروست بونی بۆشایی لەم زنجیرەیەدا هەر ئەوەنیە نەخشەیەک دەشێوێنێ و جوانیەکەی لێوەر دەگرێتەوە، بەڵکو رەنگی هەموو ئەڵقەکان تێکدەدات و دەشێوێنێ، چونکە هەر ئەڵقەیەک بۆ ئەڵقەیەکی تر بنچینەیەکە .....



لە دوێنێدا زۆرێک لەوانەی پێش خۆمان هەوڵی زۆریاندا و بەرهەمی زۆریان بۆ ئێمە جێهێشت، ئەوان بە گوێرەی دوێنێ و بە پێی کەرەستە بەردەستەکان و پێشکەوتنی ئەو رۆژە بەشێکی زۆری توانایان بەکارهێنا





بەڵام ئەمڕۆ ئێمە لە زەمەنێکی دیکەین ئەگەر هەمان توانا بەکاربهێنین و هێندەی ئەوان خاوەن ئەنجام بین، نەمان توانیوە وەکو ئەوان بین، چونکە سەردەمەکەمان زیاتر کەرەستەی پێشکەوتن و تەکنەلۆژیا و هۆکانی بەکار هێنانی هێزمانی پێداوین، بارتەقای ئەوەش دەبێت گەیشتبینە ئاستێکی تر لە هێزی پێشکەوتن کە بەشی هەرە زۆری توانا و قودرەتمان بەکار بردبێت و چەند جارەی سەردەمی پێش خۆمان بێت .....

ئەوەی ئەمڕۆی دروست کـردووە، دوێنـێـیــە، ئەوەی بەیانیش دروست دەکات ئــەمــڕۆیە







ئەمڕۆ بە هەموو جوانی و ناشیرینیەکانەوە بەرەنجامی دەستی مرۆڤانی دوێنێیە، ئەگەر لە دوێنێدا پێشینانمان بەوپەڕی هەستی بەرپرسیاریەتی و لێزانی و زانایی کاریان بکردایە، ئەمڕۆ باشتر و بە جۆرێکی تر دەژیاین، پێشینانمان سکەیەکیان دروستکرد ئەمڕۆ لەسەری دەڕۆین، قالبێکیان داڕشت ئەمڕۆ چووینە ناویەوە و تێیدا ژیان دەکەین، ژیانمان لە مرۆدا درەختێکە رەگەکانی لە دوێنێوە هاتوون و درێژ بوونەوە، جۆری درەخت و بەرهەمەکەی لە زەمەنێکی تردا دیاری کراوە ....



بەهەمان چەشن ئەمڕۆ ئێمە لە بەردەم بەرپرسیاریەتیەکی گەورەتردایین، چونکە هۆشمەندی زیاتر و هۆشیاری دوێنێ و ئەمڕۆمان هەیە، لە دوێنێدا کۆمەڵێ زانراوی ئەمڕۆ نەزانراو بوون، ئاشکرا بوونی نەزانینەکانی دوێنێ و زانراو بوونیان لە مڕۆدا ئێمە زیاتر بەرپرس دەکات لە پێشینانمان، چونکە چەندە پـانتایی نەزانراو بزانرێ ئەوەندە شێوە ژیانی زانراو و تاقی کراوە خۆی دەخاتە بەردەم پرسیار و نوکی نەشتەرگەری و شێوازی تر لە ژیان و تاقی نەکراوە خۆی دەسەپێنی.....





ئاشنا بوون بەزانین، دەرک کردن بەدەرک نەکراوەکان، زیاد بوونی پانتایی هۆشیاری، مرۆڤ سات بە سات دەخاتە بەردەم تێڕامانی قووڵ لەم حەقیقەتەی کە پێشتر مامەڵەمان لەگەڵ کردووە و دەست و پەنجەمان لەگەڵی شل کردووە، ئایا چەندە حەقیقەت وەکو ناحەقیقەت مامەڵەی لەگەڵ کراوە و ناحەقیقەت وەکو حەقیقەت وەرگیراوە و ئێمە ناچار بە پرسیارکردن و دانانی هێمای سەرسوڕمان دەکات لەم هەڵوێست و وێستگانەی کە خشکۆڵی بەلاماندا تێپەڕیون و نەمان بینیون یان لە بنچینەدا وامان زانیوە شیاوی بینین و لەسەر وەستان نین ....

ئەوە ئێمەین بەیانی ڕەنگ ڕێژ دەکەین و نەخشەی ڕۆژێکی نوێ دادەڕێژین، سەرەتایەکی نوێ دەست پێدەکەین، کۆتایی ئەو سەرەتایەش دیاری دەکەین، لێرەشەوە بەرپرسیاریەتی ئێمە دەست پێدەکات کە ئەو سەرەتایەی ئەمڕۆ دایدەڕێژین مرۆڤانێک ناچار بەکۆتایی ئەم سەرەتاییە دەکەین، کە بەجۆرێک بژین کە خۆیان دەستیان تێدا نەبووە، هەروەک چۆن ئێستا ئێمە بەناچاری لە کۆتایی ئەو سەرەتاییانەداین کە مرۆڤ گەلێ بەر لە ئێمە نەخشەیان بۆ کێشا و ئێمەیان ناچار بەم ژیانە کرد و خۆشیان بەرپرسن ...



دیاریکردنی سەرەتا و ڕێڕەوەکان جورئەتێکی گەورەی مرۆڤانەی پێویستە، چونکە مرۆڤانێکی زۆر ناچار بە جۆرێک لە شێوە ژیان و شێوە بوونێک دەکات بە جۆر و مانای دیاری کراو، کە ئەم مانایانە جۆری بوون بۆ ئەم بوونەوەرە لەم گەردوون و بوونەدا دیاری دەکەن، کە بە پێدانی مانای جیاواز، جۆری تر لە بوون و جۆری پێشکەوتنی جیاواز دێتە ئارا، بۆیە ئێمە لە پرۆسەی پێدانی مانا و جەوهەر لە بەردەم بەرپرسیاریەتیەکی گەورەی ئینسانیداین کە چ مانا و جەوهەرێک کامڵترینە ببەخشین ...



ئێمه تەنانــەت ئەوەندە بەرپرسین کە وێنــەی ئــەوان لە بارەی توانـا و هـێزی ئەوان لە بەیانیدا ئێمـــە دەیکێشین و دیـــاری دەکەین لەمرۆدا، چونکە ئەوان لەسنورێکدا دەست پێدەکەن کە ئێمە جێمان هێشتوە و دیاریمـــان کردوو، بە ریتمێک دەست پێدەکەن کە ئێمە دامانڕشتوە، بە ئاوازێک دەخوێنن کە ئێمە دامان ناوە، بۆیە ئەگەر بەرهەمی پێشینانمان و هاوتاکانمان لە مرۆدا هەڵمان خەڵەتێنێ و ئەوە نەکەین کە پێویستە بیکەین، قالبێک بۆ نەوەکانمان دادەڕێژین کە خیانەت لە مرۆڤایەتی دەکەین، چـونکە نەخشەی ئێمــە تەنها بۆ بەیانی درێــژ نابێتەوە بەڵکو بۆ دووســبەی و ئایندە درێژ دەبیتەوە و شکڵ بە ژیانی داهاتووی نەوەکانمان دەدات ...





ئێمەین ئەمڕۆ لە پرۆسەی بەخشینی مانا و نرخین بۆ ئەوانەی تر کە بەپێی ئەو مانایانە دەژین کە لە دوامانەوەن، نزیک بوونەوەی ئێمە لە کڕۆکی راستەقینەی مانای شتەکان و بەها پێدانیان بەو چەشنەی خۆیان لە جەوهەردا هەڵگری ئەو بەهایەن، ئەوەندە مرۆڤایەتی رێگەی راستەقینەی خۆی وەردەگرێت و ئینسان وەک بوونێکی خاوەن بەها دەژیت و دەمامکە درۆزنەکان دەکەون، زنجیرەکان دەکرێنەوە، کە رۆشناییان لە ژووری تاریکیدا تۆق کردووە، کەلەبچەکان دەخرێنە کار بۆ ئەو تاریکاییانەی لە پانتایی رووناکیدا بەرەڵڵا کراون، هەموو شتێ بە قەد خۆی لە توێکڵی خۆیدا دەبێت و بە قەد وجودی خۆی رێز لە وجودیەتی دەگیرێت و هەر بەو ئەندازەیەش تەعبیر لە بوونی خۆی دەکات، ئەو کات ئێمە بەرپرس نابین کاتێ بێمانایی بە ماناوە دەکرێت و جوانی وەک ناشیرینی سەیر دەکرێت و ناشیرینی وەک جوانی رێزی لێدەگیرێت....

مرۆڤ بەدووری لە بەهای رووحی، ئەگەر بە ئەوپەڕی پێشکەوتنیش بگات، هەر لە بازنەیەکی بچووکدایە

هەرچەند مرۆڤ بە دەستکەوتی گەورەی زانستی و پێشکەوتن بگات و، بگات بە دوا سنوری بەرەوپێشچوون، ئەگەر لە سنورێکی مرۆڤانە و لە بازنەیەکی سەر زەویانەوە پێی بگات، هەر لەپانتاییەکی بچوکدایە، بارتەقای ئەو مرۆڤە نیە کە لە رووحی خوای تێدایە و خەلیفەی ئەوە و بە شێوازێک لە شێوازەکان سیفەتەکانی خوا لە ئەودا رەنگ دەداتەوە، تەنانەت بەشێ لە فەلسەفە و مانای بوونی مرۆڤ ئەوەیە خودا بەندەکەی ببینێت کە جۆرێک لە ئاوێنەی رەنگ دانەوەی سیفەتەکانی ئەو بێت ....

کاتێ بەو توانا زۆر بچوکەی کە هەمانە و لە پنتێکی ئێجگار زۆر بچووک لە گەردوون گەیشتین، ئەوە جگە لە بوونی راستەقینەی گەورەیی خوا کە رەنگە لەو دنیاش ئەوتوانایەمان نەبێت لێی تێبگەین، ئینجا لە خاڵێکی زۆر بچووکی سیفەتەکان دەگەین و ئەگەر ئێمە بتوانین ئەو ئاوێنەیە بین کە بە هۆی بوونی بەشێ لە رووحی خودا تێماندا و خەلیفە بوونمان تیشکی ئەم سیفەتانە بدەینەوە چ موعجیزەیێک دەخولقێنین ؟.....





تەنها خۆبەستنەوەمان بەزەوی سوودمەند دەبین لە هێزی مرۆڤانەی زەوی و بێبەش دەبین لەو هێزە بەرزەی رووحانیانەی مرۆڤ، کە لە رێگەی زانست و پێشکەوتنەوە دەستمان پێناگات، مرۆڤی ئەمڕۆ تەنها بەسەیر کردنی زەوی گەیشتۆتە ئاستێکی گەورەی پێشکەوتن، بەڵام ئێمە دەبێت فێر بین چاوێکمان لە ئەرز بێت و چاوەکەی تر لە ئاسمان، دەستێکمان بۆخوارەوە و دەستەکەی تر بۆ سەرەوە، هەنگاوێک بۆ زەوی و هەنگاوەکەی تر بۆ ئاسمان، بۆ ئەوەی ئەوەی زانست پێی ناگات و دەشی سەلمێنی مرۆڤ ناتوانێ پێی بگات، ئێمە پێی بگەین، ئەوەی لۆژیک و مەنتق قبوڵی ناکات، بیهێنینە ئەرزی واقیعەوە، چونکە دەستی زانست بچوکە و چاوی زانست کەم بینە و رێگەی تری پێشکەوتنی تر هەیە مرۆڤ بە رووحانیەت پێی دەگات، کە هەرگیز مرۆڤ بە زانست پێی ناگات، مەگەر دەستەمۆ کردنی ئاسمانەکان بۆ مرۆڤ و هاندانی مرۆڤ کە پێی بگات تەنها بە رێگەی زانست دەکرێت؟!!

من دڵنیام مرۆڤ توانای ئێجگار گەورەی هەیە، کە لە رێگەی رووحـانیەوە پێی دەگات، وە ئەگەر پێشی نەگەیشت لەم دنیایەدا، لە دنیاکەی تر لە خۆمان دەگەین کە ئێمە کێ بووین!!




گیرسانەوە بەڕوالەت و توێکلی شتەکان بە مانای بەتاڵکردنەوەی بەیانیە لەناوەڕۆك بە مانای دوورکەوتنەوەیە لە جەوهەر بەمەش ئەمڕۆ کۆپی بەیانی دەکەین و بەیانیش ئەمڕۆ دووبارە دەکەینەوە.

